# Or

به هۆی ئه م فرمانه شه وه ئه توانین زیاتر له یه ك مه رج دابنێین بۆ روودانی کاره که مان به ڵام ئه م فرمانه ته وا و پێچه وانه ی ئه وه ی تریانه ئه گه ر ئه م فرمانه به کاربهێنین بۆ ئه وه ی دوو مه رج دابنێین بۆ روودانی کاره که مان ئه وا هه ر کام له مه رجه کان دروست بن ئه وا کاره که مان روو ئه دات واته ئه گه ر مه رجی یه که م دروست بێت وه مه رجی دووه م دروستیش نه بێت ئه و کات کاره که مان هه ر روو ئه دات چونکه ئێمه or به کار ئه هێنین .

بۆ نموونه ئه گه ر من ژماره یه ك داخل بکه م ئه وا بمه وێت ئه گه ر 0 م داخل کرد بڵێت ئه م ژماره یه به کارمه هێنه وه ئه گه ر 1- و 2- و 3- هتد م داخل کرد ئه وا پێم بڵێت ئه و ژماره یه به کار مه هێنه واته ئیستا دوو مه رج دا ئه نێم بۆ روودانی کاره که م مه رجی یه که م ئه گه ر ژماره که یه کسان بوو به 0 , وه مه رجی دووه م ئه گه ر ژماره که بچوکتر بوو له 0 واته ژاره کان بریتی بوون له 1- و 2- و 3- هتد .
به ڵام من ئه گه ر هه ر کام له مه رجه کان دروست بن ئه وا کاره که م بۆ ئه نجام بدات واته ئه گه ر ژمار ه که م یه کسان بوو به 0 کاره که م بۆ ئه نجام بدات یان ئه گه ر ژماره که بچوکتر بوو له 0

```
num = int(input("zhmara daxl bka :"));
if(num==0 or num<0):
    print("aw zhmaray bakar mahina !");
```

ئیستا ئه و وێنه ی سه ره وه شیکاری ئه و نموونه یه که باسمان کرد ئیستا ژماره 0 داخل بکه کاره که روو ئه دات

```
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
zhmara daxl bka :0
aw zhmaray bakar mahina !
>>>
```

وه ك ئه بینین ته نها یه ك مه رجمان دروست بوو به ڵام کاره که ی ئه نجام دا وه ئه گه ر 1- داخل بکه ین هه مان کار روو ئه دات چونکه مه رجی دووه م دروسته

```
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
zhmara daxl bka :-1
aw zhmaray bakar mahina !
>>>
```

راهێنان ٤

١- به رنامه یه ك بنووسه كه من چوار ژماره داخل بكه م وه كه ژماره كانم داخل كرد ژماره كان له گه وره وه بۆ بچووك ریزبه ند بكات واته بۆ نموونه من ئه و چوار ژماره یه داخل ئه كه م " ٢٢،٣٣،٤٤،١١ " باشه ئیستا كه ئه و ژمارانه داخل ئه كه م له گه وره ترین ژماره م بۆ ریزبه ند بكات به م شێوازه :

٤٤

٣٣

٢٢

١١

به م شێوازه كاره كه م بۆ ئه نجام بدات ؟؟؟؟

٢- به رنامه یه كم بۆ بنووسه كه من ٣ ژماره داخل بكه م راسته و خۆ به رنامه كه پێم بڵێت كه كام ژماره له كامه گه وره تره وه كامیان یه كسانه به یه كتری واته ئه گه ر من ئه م ٣ ژماره یه داخل بكه م " ٢٢،٢٢،٣٣ " ئه وا ئه نجامه كه ی به م شێوازه بێت :

٣٣ گه وره تره له ٢٢ وه یه كسانه به ٢٢

به م شێوازه ئه م كاره م بۆ ئه نجام بدات ؟

## While

ئه گه ر بمانه وێت كارێك چه ند جارێك دووباره بكه ينه وه ئه توانين كارێك چه نده ها جار دووباره بكه ينه وه واته به ئاره زووى خۆمان وه ده بێت مه رج دابنێين بۆ راوه ستانى كاره كه مان واته هه ر كاتێك مه رجه كه مان دروست بوو واته هه تا ئه و كاته ى كه مه رجه كه مان دروست ئه بێت ئه وا كاره كه مان بۆ ئه نجام ئه دات كاتێك كه مه رجه كه مان دروست نه بوو واته مه رجه كه مان هه ڵه بوو ئه وا راسته وخۆ كاره كه مان ئه وه ستێت

بۆ ئه وه ى ئه م فرمانه به كاربهێنين ئه وا هه موو كات پێويستمان به گۆڕاوێك هه يه واته ده بێت سه ره تا گۆڕاوێك دروست بكه ين بۆ ئه وه ى مه رجه كه ى پێ دابنێين وه ئه و گۆ ڕاوه ش پێويسته زياد بكات !

باشه با بزانين ئه م فرمانه چۆن كار ئه كات كاتێك ئه م فرمانه به كاردێنين ئه وا يه كه م جار ئه چێت مه رجه كه ئه پشكنێت ئه گه ر مه رجه كه دروست بوو ئه وا كاره كه ئه نجام ئه دات كه كاره كه ى ئه نجامدا دوو باره دێته وه مه رجه كه ئه پشكنێت ئه گه ر مه رجه كه ديسانه وه دروست بوو ئه وا دووباره هه مان كار ئه نجام ئه دات دواتر ديسان دێته وه مه رجه كه ئه پشكنێت به به رده وامى ئه م كاره ئه كات هه تا ئه و كاته مه رجه كه مان دروست نابێت واته هه ڵه ده بێت كه مه رجه كه مان دروست نه بوو كۆ تاى به كاره كه دێت

نموونه : ئه مانه وێت ووشه يه ك ١٠ جار دووباره ببێته وه باشه بۆ ئه م كاره سه ره تا گۆڕاوێك دروست ئه كه ين وه نرخى ١ پێ ئه ده ين




باشه ئێستا گۆڕاوێكمان دروست كرد كه نرخه كه ى بريتيه له ١ وه ك باسم كرد بۆ ئه وه ى بتوانين كارێك چه ند جارێك دووباره بكه ينه وه ئه وا فرمانى while

به كاردێنين بۆ ئه م مه به سته




دوای ئه وه ی ئه و فرمانه مان نووسی ئیستا ده مانه وێت مه رج دابنێین بۆ راوه ستانی ئه و کاره ی که بریاره رووبدات واته ئه و ووشه یه ی که ١٠ جار دووباره ببێته وه بۆ ئه وه ی کارێك ده جار ئه نجام بدرێت پێویسته مه رجه که وا دابنێین " هه تا وه کوو ئه و گۆڕاوه بچوکترو یه کسان بێت به ده " کاره که مان بۆ دووباره بکاته وه !




باشه ئێستا مه رجه که شمان دیاری کرد ئیستا ئه وه ی ماوه ته وه ئه وه یه که ئه و کاره دیاری بکه ین که ده مانه وێت ١٠ جار دووباره ببێته وه !




باشه ئێستا با ئه و پرۆگرامه تاقی بکه ینه وه بزانین چه ند جار ئه و نووسینه مان بۆ دووباره ئه کاته وه تۆ ش تاقی که ره وه :



ئایا نووسینه که ۱۰ جار دووباره بویه وه ؟ بێگومان نه خێر له به رچی ئه گه ر سه یری مه رجه که مان بکه ین وتمان هه تا ئه و کاته ی گۆراوه که مان بچوکتر ئه بێت له ۱۰ ئه وا کاره که مان هه ر بۆ دووباره بکاته وه باشه ئا یا گۆڕاوه که مان له ۱ زیاد ئه کات ؟ بێگومان نه خێر له به ر ئه وه گۆڕاوه که مان هه ر نرخه که ی ۱ ئه بێت که واته مه رجه که مان بۆ هه میشه راسته چونکه نرخی گۆڕاوه که مان بچوکتره له ۱۰ !

باشه ئێستا که کێشه که مان دۆزیه وه ئه م جاره کاتی ئه وه هاتووه که چاره سه ری بکه ین بۆ ئه وه ی هه ر جاره و که مه رجه که مان ئه پشکنێت که مه رجه که مان دروست بوو ئه وا کاره که مان بۆ ئه نجام ئه دات وه هه روه ها که کاره که مان بۆ ئه نجام ئه دات واته هه ر جاره وه که کاره که مان بۆ ئه نجام ئه دات گۆڕاوه که مان یه ك یه ك زیاد بكات !

واته سه ره تا که گۆڕاوه که مان ۱ بوو ئه وا که کاره که ئه نجام ئه دات ئه بێت به ۲ دیسان مه رجه که مان دروست بوو چونکه ۲ بچوکتره له ۱۰ دیسان ووشه که مان بۆ پیشان ئه دات وه هه روه ها گۆڕاوه که مان له ۲ ه وه ئه بێت به ۳ که چی دیسان مه رجه که مان دروست بوو چونکه ۳ بچوکتره له ۱۰ دیسان کاره که ئه نجام ئه دات واته ئه م کاره به رده وام ئه بێت هه تا ئه و کاته ی نرخی گۆڕاوه که مان ئه بێت به ۱۱ که نرخی گۆڕاوه که مان بوو به ۱۱ ئه و کات مه رجه که مان هه ڵه یه ! چونکه ۱۱ بچوکتر نیه له ۱۰ به ڵکو گه وره تره که گه وره تر بوو ئیتر کاره که هیچی تر دووباره نابێته وه چونکه مه رجه که کۆتایی پێهات !

```
counter = 1;
while(counter<=10):
    print("Python Language In Kurdish ");
    counter = counter +1;
```

وه ئه بینین هه ر جاره وه که کاره که ئه نجام ئه دات نرخی گۆڕاوه که مان کۆ ده کرێته وه له گه ڵ یه ك واته نرخی ئه و گۆڕاوه ی که دروستمان کردووه بۆ راوه ستانی کاره که مان هه ر جاره و یه ك یه ك زیاد ئه کات !

ئیستا سه یری ئه نجامه که ی بکه ن ئه و ووشه یه ده بێت ۱۰ جار دووباره ببێته وه !

```
>>>
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
Python Language In Kurdish
>>>
```

وه بۆ ئه وه ی ببینین که چۆن نرخی گۆڕاوه که مان له ١ یه وه یه ك یه ك زیاد ئه كات هه تا ئه بێت به ١٠ ئه وه ئه و گۆڕاوه پرێنت ئه که ین :

```
counter = 1;
while(counter<=10):
    print(counter);
    print("Python Language In Kurdish ");
    counter = counter +1;
```

ئیستا ئه گه ر سه یری ئه نجامه که بکه ین ئه وا ده بینین گۆڕاوه که مان چۆن یه ك یه ك زیاد ئه كات هه ر جاره ی که ووشه که مان بۆ پیشان ئه دات :

```
1
Python Language In Kurdish
2
Python Language In Kurdish
3
Python Language In Kurdish
4
Python Language In Kurdish
5
Python Language In Kurdish
6
Python Language In Kurdish
7
Python Language In Kurdish
8
Python Language In Kurdish
9
Python Language In Kurdish
10
Python Language In Kurdish
>>>
```

نموونه : بۆ ئه وه ی زیاتر له بابه ته که بگه ن ئه وا نموونه یه کی ترتان بۆ شیکار ئه که م، باشه ئیستا ده مانه وێت ژماره یه ك داخل بكه ین به کیبورد ئه و ژماره یه دوو دوو زیاد بكات به مه رجێك ژماره که له ٢٠ زیار نه بێت ، باشه سه ره تا گۆڕاوێك دروست ئه که ین که گۆڕاوه که وا بكات ژماره به هۆی کیبورد داخل بکه ین , :

```
x=int(input("enter:"));
```

باشه ده مانه وێت هه تا کوی ئه و ژماره یه ی که داخلی ئه که ین ز یاد بكات , باشه وادا ئه نێین که ژماره که گه یشت به ٢٠ راسته و خۆ کاره که کۆتای پێبێت , که واته ده بێت مه رجێك دابنێین مه رجه که به و شێوازه ئه بێت " هه تا ئه و کاته ی که گۆڕاوه که بچوکتر و یه کسانه به ٢٠ " ئه وه ئه و ژماره یه ی که داخلمان کردووه هه ر دوو دوو زیاد بكات ئه وه بریتی بوو له مه رجی دوو باره بوونه وه ی کاره که مان !

```
x=int(input("enter:"));
while (x<=20):
```

باشه ئیستا مه رجه که شمان دانا به ڵام ده بێت وابکه ین گۆڕاوه که مان دوو دوو زیاد بكات واته ئه و ژماره یه ی که داخلی ئه که ین دوو دوو زیاد ئه کات هه تا ئه و کاته ی ئه گات به ٢١ ئه و کات کاره که مان کۆتای پێدێت چونکه مه رجه که مان دروست نابێت گۆڕاوه که مان گه وره تر ئه بێت له ٢٠ :

```
x=int(input("enter:"));
while (x<=20):
    print(x);
    x = x+2;
```

ئيستا ئه گه ر ژماره ٨ داخل بكه ين سه يركه چۆن ئه و ژماره يه دوو دوو زياد ئه كات هه تا وه كو ئه گات به ٢٠ !

```
enter:8
8
10
12
14
16
18
20
>>>
```

X 2= X1 + 2;

ئه م كاره چۆن ئه نجام ئه درێت سه ره تا كه ئێمه ژماره ٨ داخل ئه كه ين بۆ نمونه ئه وا نرخی

**X1 = 8**

كه له گه ڵ ٢ كۆ ئه كرێته وه ئه بێت به ١٠ كه واته نرخه كه ئه بێت به

**X2 = 10**

وه

**X1 = 10**

ديسان كه له گه ڵ ژماره ٢ كۆ ئه كرێته وه به م شێوازه زياد ئه كات !

" **هه ميشه هه وڵده چونكه باشترين رێگه يه بۆ ئامانجه كانت** "

نووسه ر : دانا صدرالدين

زانكۆی سۆران – زانستی كۆمپيوته ر

قۆناغی دووه م

راهێنان ٥

١- پرۆگرامێك بنووسه كه من ژماره ٧ داخل بكه م ئه وا جارانى ژماره ٧ م پێبدات هه تا كو ١٠ واته به م شێوازه وه هه روه ها ئه نجامه كه شى وه ك ئه مه ى خواره وه بێت :

7 X 1 = 7

7X2 = 14

...........

7X10 = 70

واته هه ر ژماره يه ك كه داخل بكه م ئه وا خشته ى لێدانه كه م پێبدات هه تا ژماره ١٠ ؟

٢- به رنامه يه كم بۆ بنووسه كه ئه م كاره م بۆ ئه نجام بدات واته كاتێك من ژماره ٦ داخل بكه م ئه وا به م شێوازه كار بكات :

1X2X3X4X5X6 = 720

واته هه ر ژماره يه ك داخل بكه م هه مان كارم بۆ ئه نجام بدات وه ئه نجامه كه شم پيشان بدات ؟

٣- به رنامه يه ك دروست بكه كه من ژماره يه ك داخل ئه كه م ئه وا ئه و ژماره يه ئه گه ر گه وره تر بوو له ٢ ئه وا بنوسرێت " دروسته " ئه گه ر نا " دروست نيه " به ڵام شتێك ئه نجام بده هه ر كاتێك ژماره كه مان داخل كرد وه مه رجه كه دروست بوو دواتر داواى ئه وه ت لێبكات كه ئه گه ر ژماره ١ داخل بكات ئه وا به رنامه كه بوه ستێت به ڵام هه ر ژماره يه كى تر داخل بكه يت به رنامه كه دووباره كار بكاته وه ؟

# For

ئه م فرمانه ش وه كو فرمانه كه ی پێشوو هه مان كاری دووباره بوونه وه ی كردارێك ئه نجام ئه دات واته بۆ ڕودانی كارێك كه بمانه وێت كاره كه مان دووباره ببێته وه ئه وا مه رج ده بێت دابنێين بۆ وه ستانی كاره كه مان تاوه كو بزانين كاره كه مان له كوێ له دووباره بوونه وه ئه وه ستێت ئه توانين ئه م فرمانه به كاربهێنين .

نموونه ده مانه وێت ووشه يه ك ١٠ جار دووباره ببێته وه بۆ نموونه سه ره تا گۆڕاوێك دروست ئه كه ين

```
For x
```

ئيستا گۆڕاوێكمان دروست كرد دواتر ئه م فرمانه ئه نووسين

```
For x in range
```

واته گۆڕاوه كه مان له و مه ودايه دا بێت دوای ئه وه سه ره تا نرخی گۆڕاوه كه مان ئه نووسين

```
For x in range (0)
```

ئيستا نرخی گۆڕاوه كه مان بوو به 0 واته گۆڕاوه كه مان سفره به ڵام ئێمه ده بێت مه رج دابنێين بۆ كاره كه مان واته تاوه كو كاره كه مان دووباره ببێته وه بۆ ئه م كاره له دوای نرخی گۆڕاوه كه مان ئه نووسين ١٠ واته هه تا وه كو گۆڕاوه كه مان بچوكتر و يه كسان ئه بێت به ١٠ ئه وا كاره كه مان هه ر بۆ دووباره ئه كاته وه

```
For x in range (0,10):
```

دوای ئه وه ی مه رجه كه شمان دياری كرد ده بێت وابكه ين كه نرخی گۆڕاوه كه مان يه ك يه ك زياد بكات بۆيه له دوای مه رجه كه مان ژماره ١ ئه نووسين واته گۆڕاوه كه مان يه ك يه ك زياد ئه كات هه تاوه كو ئه گات به ١١ كه گه شت به ١١ ئه و كات كاره كه مان ده وه ستێت چونكه مه رجه كه مان هه ڵه ده رده چێت

```
For x in range (0,10,1):
```

ئيستا ئه گه ر ئه و كاره دياری بكه ين كه ده مانه وێت رووبدات ئه وا ده ينوسين بۆ نموونه ده مانه وێت بۆ مان بنووسێت " خۆشمه وێيت "

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
for x in range (0,10,1):
    print("خوشمه ویـیـت ");
```

ئیستا ئه گه ر سه یری ئع نجامه که ی بکه ین ده بینین ١٠ جار ئه م ووشه یه دووباره بۆته وه

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
خوشمه ویـیـت
>>>
```

10

بۆ نمونه ئه گه ر بمانه وێت گۆڕاوه که مان ببینین که چۆن نرخه که ی زیاد ئه کات یه ك یه ك ئه وا ئه م کاره ئه که ین

```
*new.py - C:\Python32\new.py*
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
for x in range (0,10,1):
    print("خوشمه ویـیـت ");
    print(x);
```

ئه نجامه که ی سه یرکه ن



وه هه روه ها به م شێوازه ئه توانين مه رج دابنێين بۆ دووباره بوونه وه ى كاره كه مان سه ره تا ناو گۆڕاوه كه ئه نووسين دواتر نرخ ئه ده ين به گۆڕاوه كه دواتر مه رجه كه ى بۆ دائه نێين دواتريش گۆڕاوه كه مان زياد ئه كه ين جا چ يه ك يه ك چ دوو دوو .... هتد به ئاره زووى خۆته

نموونه يه كى تر :

ده مانه وێت ژماره يه ك داخل بكه ين دواتر ئه و ژماره يه ى داخل بكه ين ببێت به مه رجى دووباره بونه وه ى كاره كه مان سه ره تا گۆراوێك دروست ئه كه ين ئه وگۆڕاوه رێ به وه بدات كه به هۆى كيبورد ژماره داخل بكه ين

```
X = int(input('enter:'));
```

دواى ئه وه گۆراوێكى تر دروست ئه كه ين نرخێكى پێ ئه ده ين به م شێوازه

```
For y in range (1,):
```

ئيستا نرخه كه مان دا به گۆڕاوى دووه م كه تايبه ته به وه ستانى كاره كه مان كه نرخه كه ى بريتيه له ١ باشه ئيستا مه وه ته وه مه رج دابنێين به لاْم ئێمه ووتمان مه رجه كه به كيبورد داخل ئه كه ين بۆيه ته نها ناوى ئه و گۆڕاوه ئه نووسين كه تايبه ته به داخل كردنى ژماره

```
X = int(input('enter:'));
For y in range (1,X):
```

دواتر گۆڕاوى دووه مان چه ند چه ند زياد بكات بۆنموونه با گۆڕاوه كه مان دوو دوو زياد بكات

```
X = int(input('enter:'));
For y in range (1,X,2):
```

باشه ده مانه وێت ئه و ووشه یه مان بۆ دووباره بکاته وه " کوردستان "

```
X = int(input('enter:'));
for y in range (1,X,2):
    print("Kurdistan");
```

باشه ئێستا سه یری ئه نجامه که ی بکه به لاّم ووتمان به کیبورد مه رجه که مان دیاری ئه که ین بۆ نموونه به کیبورد دیاری ئه که ین که گۆڕاوه که مان له چه ند بچوکتر بێت بۆ دووباره بوونه وه ی کاره که مان باشه ئیستا ژماره ١٤ داخل بکه :

```
enter:14
Kurdistan
Kurdistan
Kurdistan
Kurdistan
Kurdistan
Kurdistan
Kurdistan
```

راهێنان ٦

١- به رنامه یه ك بنووسه که ژماره ١٠ داخل بکه م هه موو ژماره جووته کانم بۆ ریز بکات واته به م شێوازه " ٢،٤،٦،٨،١٠ " به م شێوازه ؟

## Function

ئه كێك له و فرمانه به سوودانه ی كه له زۆربه ی زمانه كانی پرۆگرامسازیدا بوونیان هه یه ئه م فرمانه ی سه ره وه كه به مانای نه خشه دێت , به هۆی ئه م فرمانه وه ئه توانین كارێك ئه نجام بده ین واته نه خشه یه ك دروست ئه كه ین ئه و نه خشه یه كارێكی پێ ئه سپێرین به لآم ئه و نه خشه یه كاره كه ی خۆی ئه نجام نادات هه تا ئه و كاته ی ئێمه بانگی ئه كه ین واته به ئاره زوی خۆمانه ئه توانین نه خشه كه مان به كاربهێنین یان به كاری بهێنین ره نگه بڵێت باشه سوودی چیه ؟

بۆ نموونه كاتێك تۆ به رنامه یه ك دا ئه ڕێژیت واته به رنامه یه ك ئه نووسیت له وانه یه له ناو به رنامه كه كارێك چه ند جارێك دووباره ببێته وه جا له به ر ئه وه تۆ هه م بۆ ئه وه ی ئه و كاته ت بۆ بگه رێته وه كه به هۆی ئه وه ی چه ند جارێك هه مان كار دووباره ئه نووسیته وه وه هه م بۆ ئه وه ش كه پێویست ناكات ئه و كاره هه ر دووباره بكه بته وه وه هه روه ها شوێنی كه متر ئه گرێت ئه گه ر تۆ یه ك جار نه خشه یه ك دروست بكه یت ئه و كاره ی پێبسپێریت له هه ر كاتێك ویستت به كاری بێنیت ئه وا ئه توانیت بانگی نه خشه كه ت بكه یت بۆ ئه وه ی كاره كه ی ئه نجام بدات .

بۆ دروستكردنی نه خشه سه ره تا ده بێت ئه م فرمانه بنووسین def كه به كاردێت بۆ دروستكردن

```
def
```

دوای ئه مه ده بێت ناوێك بۆ نه خشه كه مان دیاری بكه ین بۆ ئه وه ی ئه گه ر ویستمان كار به نه خشه كه مان بكه ین یان بانگی بكه ین ئه وا ده بێت ناوێك هه بێت بۆ ئه وه ی بیناسینه وه !

```
Def  SoranU():
```

ئیستا وه ك ئه بینین ناوێكمان دیاری كرد بۆ نه خشه كه مان دوای ئه وه ی كه نه خشه یه كمان دروستكرد ئیستا ده مانه وێت كارێك بده ین به و نه خشه یه ی كه دروستمان كردووه واته هه ر كاتێك ئه و نه خشه یه مان بانگكرد ئه وه ئه و كاره مان بۆ ئه نجام بدات كه بۆی دیاری كراووه

بۆ نموونه ده مانه وێت نووسینێكمان (رسته ) بۆ ده ربخات به م شێوازه ی خواره وه :

```
File Edit Format Run Options Windows Help
def SoranU():
    print("It IS My College ");
```

باشه ئیستا نه خشه كه مان دیاری كرد وه كاریكمان پێی سپاردووه به لام ئه گه ر ئه مه كار پێبكه ین وه سه یری ئه نجامه كه ی بكه ین هیچ كاریكمان بۆ ئه نجام نادات چونكه ئه وه نه خشه یه وه سیفه تی نه خشه ئه وه یه كاره كه ی ئه نجام نادات هه تاوه كو بانگی نه كه ین !!!

بۆ نمونه من ده مه وێت بانگی نه خشه كه م بكه م بۆ ئه وه ی ئه و كاره ی كه پێی سپێردراووه ئه نجامی بدات تاوه كو ئه نجامی كاره كه م ببینم به م شێوازه بانگی نه خشه كه مان ئه كه ین كه ناوی ئه و نه خشه یه ئه نووسین كه ده مانه وێت بانگی بكه ین چوونكه له وانه یه تۆ چه ند نه خشه یه كت هه بێت له ناو به رنامه كه ت :

```
File Edit Format Run Options Windows Help
def SoranU():
    print("It IS My College ");

SoranU();
```

ئیستا سه یری ئه نجامه كه ی بكه ن

```
Python 3.2.2 (default, Sep  4 2011, 09:51:08) [MSC v.1500 32 bit (Intel)] on win
32
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
It IS My College
>>>
```

نموونه :

بۆ نموونه ده مه وێت دوو نه خشه دروست بکه م دوای ئه وه ی هه ردوو نه خشه که مان دروستکرد ئه م جاره ده مه وێت کاریان پێبسپێرم وه هه روه ها مه رج دابنێم بۆ ئه وه ی کام نه خشه بانگبکرێت

١ – سه ره تا نه خشه یه ك دروست ئه که ین وه هه روه ها کارێك ئه ده ین به نه خشه ی یه که م به م شێوازه ی خواره وه

```
def one():
    print("you choose first Function");
```

باشه ئیستا نه خشه ی یه که مان دروستکرد وه کارێکمان پێی سپاردووه به ڵام جاری هیچ کارێك ئه نجام نادات چونکه بانگمان نه کردووه

٢- ئه م جاره هه ڵده ستین به دروستکردنی نه خشه ی دووه م وه ناوێکی جیاواز له ناوی نه خشه ی یه که می بۆ دائه نێین بۆ ئه وه ی جیاواز بن له گه ڵ یه کتر دوای ئه وه کارێکی پێ ئه سپێرین به م شێوازه :

```
def one():
    print("you choose first Function");


def last():
    print("you choose Last Function");
```

٣- ئیستا ده مانه وێت به کارهێنه ر ژماره داخل بکات به هۆی کیبۆرد دواتر مه رجی بۆ دائه نێین ئه گه ر ژماره که یه کسان بوو به 1 ئه وا نه خشه ی یه که م بانگبکرێت وه ئه گه ر نا واته ئه گه ر ژماره که واته ئه و ژماره ی که داخلی ئه که ین یه کسان نه بوو به 1 ئه وا نه خشه ی دووه م بانگبکرێت کاره که ی ئه نجام بدات :

```
def one():
    print("you choose first Function");


def last():
    print("you choose Last Function");

x=int(input("Enter:"));
if(x==1):
    one();
else:
    last();
```

باشه ئيستا ده مانه وێت ئه نجامی كاره كه مان ببينين كاتێك كار به ئه و به رنامه یه ئه كه ین راسته وخۆ داوات لێئه كات كه ژماره یه ك داخل بكه یت ئيمه ئه گه ر ژماره ١ داخل بكه ین ئه وا نه خشه ی یه كه م بانگ ئه كرێت چونكه مه رجه كه مان دروست ئه بێت :

```
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
Enter:1
you choose first Function
>>>
```

به ڵام ئه گه ر هه ر ژماره یه كی تر جگه له ژماره ١ داخل بكه یت ئه وا نه خشه ی دووه م كار ده كات

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
Enter:2
you choose Last Function
>>>
```

ئيستا فيرى ئه وه بووين وه له وه گه يشتين كه چۆن نه خشه دروست بكه ين وه هه روه ها بانگى بكه ين به ڵام ئه توانين له ناو نه خشه دا گۆڕاوه به كاربهێنين واته كاتێك نه خشه يه ك دروست ئه كه ين گۆڕاوێكى پێ ئه ده ين دواى ئه وه ى كه بانگى نه خشه كه مان كرد له كاتى بانگكردنى نه خشه كه نرخى گۆڕاوه كه ديارى ئه كه ين !!!

بۆ نمونه سه ره تا نه خشه يه ك دروست ئه كه ين وه له ناو نه خشه كه گۆڕاوێك دروست ئه كه ين به ناوى X

```
Def test(X):
```

وه ئه بينين نه خشه يه كمان دروست كرد وه دواتر گۆڕاوێكمان به كارهێنا له ناو له نه خشه كه مان كه دواى ئه وه ى بانگى نه خشه كه ئه كه ين نرخ ئه ده ين به گۆڕاوه كه مان بۆ نمونه ده مانه وێت نرخى گۆڕاوه كه مان له گه ڵ ژماره ٢ كۆ بكه ينه وه وه ئه نجامه كه مان له گۆڕاوێكى نوێ پيشان بدات

```
def test(X):
    y = X+3;
    print(y);
```

سه يركه ن نه خشه يه كمان دروست كرد وه گۆڕاوێكمان ديارى كرد بۆ نه خشه كه مان دواتر ئه و گۆڕاوه ى كه له ناو نه خشه كه دا هه يه كۆمان كرده وه له گه ل ژماره ٣ به ڵام ئيستا گۆڕاوه گۆڕاوه كه مان هيچ نرخێكى نيه

بۆ يه له و كاته ى بانگى گۆڕاوه كه مان ئه كه ين ئه وا نرخى پێ ئه ده ين به م شێوازه

```
def test(X):
    y = X+3;
    print(y);

test(3);
```

سه يركه ن له و كاته ى بانگى نه خشه كه مان كرد ئه وا ده بينين نرخێكمان پێدا كه نرخه كه بو به ٣ دواتر له ناو نه خشه كه نرخى ئه و گۆڕاوه ى كه په يوه سته به نه خشه كه مان له گه ڵ ژماره ٣ كۆده بێته وه نرخه كه ى بوو به ٦

```
32
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
6
>>>
```

ئيستا له و كاته ى كه بانگى نه خشه كه مان ئه كه ين ئه گه ر ژماره يه كى تر بده ين به گۆڕاوه كه ما ن ئه وا ئه نجامه كى جياواز ده بێت

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
def test(X):
    y = X+3;
    print(y);

test(7);
```

ئه نجامه كه ى :

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
10
>>>
```

نموونه :

ده مانه وێت نه خشه یه ك دروست بکه ین دواتر دوو گۆڕاو له گه ڵ نه خشه که دا هه بن دواتر له ناو نه خشه که هه ردوو گۆڕاوه که کۆ بکرێنه وه دواتر نرخی هه ردوو نه خشه که به هۆی کیبۆرد داخل بکه ین.

بۆ ئه م کاره سه ره تا نه خشه یه ك دروست ئه که ین وه دوو گۆڕاو دروست ئه که ین :

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
def test(x,y):
    z = x+y;
    print(z);
```

نه خشه که مان دروست کرد وه نه خشه که مان دوو گۆڕاوی هه یه وه نرخی هه ردوو گۆڕاوه که ش به هۆی کیبۆرد داخل ئه که ین به م شێوازه :

```
new.py - C:\Python32\new.py
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
def test(x,y):
    z = x+y;
    print(z);


test(int(input("enter num1:")),int(input("enter num2:")));
```

x          y

باشه ئیستا سه یری ئه نجامه که ی بکه داوات لێئه کات ژماره ی یه که م داخل بکه یت دواتر ژماره ی دووه م دوای ئه وه هه ردوو ژماره که کۆئه کرێته وه :

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
enter num1:3
enter num2:2
5
>>>
```

ئه مه ی سه ره وه بریتیه له ئه نجامه كه ی .

نووسه ر : دانا صدرالدين

زانكۆی سۆران – زانستی كۆمپیوته ر

## Tuple

ئێمه فێری ئه وه بووین که ئه توانین گۆڕاو دروست بکه ین وه ئه توانین نرخیشیان پێبده ین به ڵام ناتوانین له یه ك نرخ زیاتر تایبه ت بکه ین به گۆڕاوێك ! به ڵام به هۆی ئه م فرمانه وه ئه توانین زیاتر له یه ك نرخ ته رخان بکه ین یاخود بیده ین به گۆڕاوێك

وه ئه و نرخانه ی که تایبه ت ئه که ین به گۆڕاوێك هه ر نرخه و شوێنی خۆی هه یه واته که من نرخی یه که م ئه ده م به گۆڕاوه که م ئه وا شوێنه که ی ئه بێت به 0 که واته ئه گه ر بمه وێت نرخی یه که م وه ربگرم له گۆڕاوه که م ئه وا ده بێت بانگی شوێنه که ی بکه م که بریتیه له 0 !!

بۆ نموونه گۆڕاوێك دروست ئه که ین وه ئه و نرخانه ی پێ ئه ده ین :

٢٢،٣٣،٤٤،٥٥،٧٧

ئیستا سه یرکه ن چۆن گۆڕاوه که دروست ئه که ین :

```
X = (22,33,44,55,77);
```

وه ك ووتم هه ر یه ك له و نرخانه ی که دامان ناون ئه وا شوێنیان هه یه وه شوێنه کانیش له سفره وه ده ست پێ ئه که ن واته ئیستا شوێنی ئه و نرخانه به م شێوازه یه :

| شوینه کان | 0 | 1 | 2 | 3 | 4 |
|---|---|---|---|---|---|
| نرخه کانیا ن | 22 | 33 | 44 | 55 | 77 |

ئیستا ئه گه ر شوێنی 2 وه ربگرین نرخه که ی واته ئه و نرخه ی که له و شوێنه هه یه بریتیه له 44 واته هه رکاتێك ویستمان ژماره 44 به کاربهێنین ئه وا پێویسته بانگی شوێنی 2 بکه ین !

ئیستا چۆن بتوانین بانگی ئه و نرخانه بکه ین واته ئه گه ر بمانه وێت یه ك له و نرخانه به کاربهێنین ئه وا چۆن ئه و کاره ئه که ین سه ره تا ناوی گۆڕاوه که ئه نووسین , دواتر شوێنی ئه و گۆڕاوه ی که ئه ته وێت به کاری بهێنیت بۆ نموونه من ده مه وێت ژماره ٧٧ به کاربهێنم ده بێت بزانم ئه و ژماره ی که ده مه وێت به کاری بهێنم شوێنه که ی چه نده , ئیستا شوێنی ئه و ژماره یه بریتیه له ٤ که واته شوێنی ژماره 4 بانگ ئه که م :

```
X [4];
```

ئيستا ئه گه ر ئه مه ی سه ره وه بيكه ين به نموونه به م شێوازه ئه بێت :

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
x = (22,33,44,55,77);

print(x[4]);
```

ئيستا ئه گه ر سه يری ئه نجامه كه ی بكه ين ده بينين ژماره ٧٧ پيشان ئه دات چونكه ئه و شوێنه ی كه بريتيه له 4 نرخه كه ی بريتيه له ٧٧ سه يركه ن :

```
>>> ============================== RESTART ==============================
>>>
77
>>>
>>>
```

نموونه : ئه گه ر بمانه وێت هه ر له نموونه ی سه ره وه ئه و دوو ژماره يه كۆ بكه ينه وه كه له خانه ی واته شوێنه كه يان بريتيه له ٢ ، ٤ كه واته به م شێوازه ئه م كاره ئه كه ين :

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
x = (22,33,44,55,77);

ko = x[2]+x[4];

print(ko);
```

= 121

سه يری ئه نجامه كه ی بكه ن :

```
Python 3.2.2 (default, Sep  4 2011, 09:51:08) [MSC v.1500 32 bit (Intel)] on win
32
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
121
>>>
```

نووسه ر : دانا صدرالدين خدر

زانكۆى سۆران – زانستى كۆمپيوته ر



**کۆتای**

خوێنه ری خۆشه ویست ئه مه ی که له م کتێبه دا باس کراوه دلۆپێکی زور زور بچوکه له ده ریای مه زنی پرۆگرامسازیدا , لیره دا کۆتای به باسکردنی ئه و بابه ته ئه هینم هیوام وایه بابه ته که م به جوانی روون کردبێته وه وه به جوانی سه ره تایه ك فیرببن له جیهانی به رنامه دارێژیدا .

وه هه ر هه ڵه یه ك که له بابه ته که دا بوونی هه بێت یان له هه ر شتێکدا ئه وا هیوام وایه بم به خشن وه هیوام وایه ئاگادارم بکه نه وه بۆ ئه وه ی له بابه ته کانی تردا ئه م هه ڵانه دووباره نه که مه وه وه له کۆته یدا هیوام وایه به رده وام بم بۆ بڵاوکردنه وه ی زانیاری ده رباره ی کۆمپیوته ر به زمانی شرینی کوردی له هه موو بواره کانی کۆمپیوته ردا بۆ ئه وه ی گه نجی کورد شاره زای هه بێت ده رباره ی بابه ته کانی کۆ مپیوته ر و بواره جیا جیکانیدا .

وه داواکارم له و که سانه ی که ئه گه ر زانیاریه کی بچوکیشیان هه یه ئه وا هیوام وایه به بێ دوو دڵی بڵاوی بکه نه وه بۆ ئه وه ی هه موو مان سوود به یه ك بگه ینین وه خزمه تی کتێبخانه ی کوردی بکه ین له هه موو بوارێکدا , له کۆتایه که ی هیوادارم که ئاگاارم بکه نه وه له هه ر هه ڵه یه کدا به م ناونیشانانه ی خواره وه , هیوای سه رفرازی و سه ر که وتن بۆ هه مووتان ئه خوازم .

نووسه ر : دانا صدرالدين

زانکۆی سۆران – زانستی کۆمپیوته ر

Blue.dana2292@yahoo.com

Facebook.com/2292.dana

```
x = int(input("zhmaray aykam :"));
y = int(input("zhmaray dwam :"));

z = x-y;
print(z);
```

ئه نجامه كه ى

```
>>>
zhmaray aykam :5
zhmaray dwam :3
2
>>>
```

## پرسيارى دووه م

```
x = int(input("zhmaray aykam :"));
z = x * 3;
print(z);
```

ئه نجامه كه ى

```
>>> ============================== RESTART ==============================
>>>
zhmaray aykam :7
21
>>>
```

## راهێنانی دووه م

### پرسیاری یه كه م

```
File Edit Format Run Options Windows Help
x = 20 ;
y = 1200
z = 20*1200;
if(z>=20000):
    print("aw bra parayat la 20000 zyatra ");
```

ئه نجامه كه ی

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
aw bra parayat la 20000 zyatra
>>> |
```

### پرسیاری دووه م

```
File Edit Format Run Options Windows Help
x= input("nawakat daxl bka :");
if(x=="soran"):
    print("aw nawa pishtr bakar hatwa");
```

ئه نجامه كه ی

```
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
nawakat daxl bka :soran
aw nawa pishtr bakar hatwa
>>>
```

## پرسیاری سێیه م

```
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
x= int(input("dahatakat daxl bka :"));
if(x>200000):
    print("dahatakat la asti xoyati ");
```

ئه نجامه كه ی

```
>>>
dahatakat daxl bka :200001
dahatakat la asti xoyati
>>>
```

## پرسیاری چواره م

```
30 / 46
File  Edit  Format  Run  Options  Windows  Help
x = int(input("zhmaray yakam :"));
y = int(input("zhmaray dwam :"));

if(x>y):
    print("zhmaray yakam gawratra la zhmaray dwam ");

if(y>x):
    print("zhmaray dwam gawratra la zhhmaray yakam");

if(x==y):
    print("zhmaray yakam yaksana ba zhmaray dwam !");
```

ئه نجام ئه گه ر ژماره ی یه كه م گه وره تر بوو

```
>>>
zhmaray yakam :5
zhmaray dwam :4
zhmaray yakam gawratra la zhmaray dwam
>>>
```

ئه نجام ئه گه ر ژماره دووه م گه وره تر بوو

```
>>>
zhmaray yakam :4
zhmaray dwam :5
zhmaray dwam gawratra la zhhmaray yakam
>>>
```

ئه نجام ئه گه ر هه ردوو كيان يه كسان بوون

```
>>>
zhmaray yakam :2
zhmaray dwam :2
zhmaray yakam yaksana ba zhmaray dwam !
>>>
```

راهێنانی سێیه م

پرسیاری یه که م

```
x= 150000
y = 1200
z= x%y;
if(z==0):
    print("mawa namawatawa ");
else:
    print("mawa mawatawa");
```

ئه نجامه که ی

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
mawa namawatawa
>>>
```

## پرسیاری دووه م

```
x = int(input("zhmaray yakam :"));
y = int(input("zhmaray dwam :"));
if(y==0):
    print("ko krdnawa anjam nadam !");
else:
    z = x + y;
    print(z);
```

ئه نجامی ١

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
zhmaray yakam :2
zhmaray dwam :3
5
>>>
```

ئه نجامی ٢

```
>>>
zhmaray yakam :2
zhmaray dwam :0
ko krdnawa anjam nadam !
>>>
```

## پرسیاری سێیه م

```
x = int(input("enter :"));
z = x%2;
if(z==0):
    print("zhmaraka juta");
else:
    print("zhmaraka taka ");
```

## ئه نجامی ١

```
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
enter :3
zhmaraka taka
>>>
```

## ئه نجامی ٢

```
>>>
enter :6
zhmaraka juta
>>>
```

## پرسیاری چواره م

```
x = int(input("enter :"));

a = x / 10000;
re = x % 10000;
b = re / 1000;
re = re % 1000;
c = re / 100 ;
re = re % 100;
d = re / 10 ;
re = re % 10;


print(re,d,c,b,a);
```

## ئه نجام

```
>>>
enter :12345
5 4.5 3.45 2.345 1.2345
>>>
```

## پرسيارى پێنجه م

```
x = int(input("enter :"));

a = x / 25000;   ## ama bo 25000 yakaya
re = x % 25000;

b = re / 10000;  ## ama bo 10000 yakaya
re = re % 10000;

c = re /5000     ## ama bo  5000 yakaya
re = re % 5000;

d = re / 1000 ;  ## ama bo 1000 yakaya
re = re % 1000;

e = re / 500 ;   ## ama bo 500 yakaya
re = re % 500 ;

f = re / 250 ;   ## ama bo 250 yakaya
re = re % 250 ;

## esta agar 25000 habu pishanman bdat yan 1000 e yan 5 yan 500 yan 250

if(a!=0):
    print('we have ',a,' == 25000');

if  (b!=0):
    print('we have ',b,'== 10000');

if(c!=0):
    print('we have ',c,'== 5000');

if(d!=0):
    print('we have ',d,'== 1000');
if(e!=0):
    print('we have',e,'== 500');

if(f!=0):
    print('we have ',f,'== 250');
```

ئه نجام

```
Type "copyright", "credits" or "license()" for more information.
>>> ================================ RESTART ================================
>>>
enter :41500
we have  1.66  == 25000
we have  1.65 == 10000
we have  1.3 == 5000
we have  1.5 == 1000
we have 1.0 == 500
>>>
```

ئه مانه بريتى بوون له شيكارى كۆمه ڵێك له پرسياره كانى راهێنان جا ئه وانه ى تر خۆت شيكارى بكه !!